## ریکلام

# کورد و کوردستان

## لە بەڵگەنامە نهێنییەکانی حکومەتی فەرەنسا و بەریتانیادا





# دواخاڵ



## دیموکراسیەت هەم دەردە و هەم دەرمان

تۆفیق کەریم

لەو رۆژەوە مرۆڤ سەرزەوی ئاوەدانکردوەتەوە، بەدیهێنەرەکەی ئاوەزی ئەوەشی پێبەخشیوە کە چۆن کاروباری خۆی و دەوروبەرەکەی بەرێوەببات.

لە هەر قۆناغێکی مێژوویشدا بەپێی گۆڕانکاری و پەرەسەندنە ژیارییەکان شێوازی بەڕێوەبردن و دەسەڵاتدارییەکە گۆڕاوە. هەر بە نموونە ئەو ئاوەز و شێوازەی کە (زولقەرنەین) ئەسکەندەری مەقدۆنی وڵاتی پێ بەڕێوەبردوە، بەپێی ئاماژە قورئانییەکان، تەواو جیاوازە لەوەی فەرمانڕەوا ئافرەتەکە (بەڵقیس)ی (سەبەء) دەسەڵاتداریتی کردوە. لە دوای ئەوانیشەوە پاشا و فیرعەون و سەرکردەی جۆراو جۆر و سیستەمی جیاواز هاتونەتە سەر دەسەڵات بۆ بەڕێوەبردنی وڵاتان.

تا لەم چەند سەدەیەی دواییدا چەندین تیۆر و بیرۆکەی جیاواز و هەشیانە دژبەیەک پەیدا بوون، بەسوودوەرگرتن لەوانەی رابردو و پشتبەستن بە پەرەسەندن و گۆڕانکارییەکان. کە لەئێستادا درێژترین و بەرفراوانترینیان سیستەمی دیموکراسییە، ئەمیش بیرۆکەیەکی کۆنی نوێیە، بەپێی هەلومەرج و گۆڕانکارییەکان گەشەی سەندوە. ئەم سیستەمە ئەمڕۆ بەربڵاوترین سیستەمە کە باسی لێوە بکرێت و لافی جێبەجێکردنی لێ بدرێت. هەرچەندە زێدی ئەم نەوزادە رۆژئاوایە و هەرلەوێش بوەتە کۆرپەلە و قۆناغەکانی دیکەی تەمەنی بڕیوە، بەڵام لە وڵاتێکی ئەوێشەوە بۆ وڵاتێکی دیکە لە جێبەجێکردندا جیاوازی هەیە.

ئەم سیستەمە دوا بەرهەم و دەرئەنجامی ئاوەزی مرۆڤەکانە کە تا ئێستا پێی گەیشتون و لە قەوارەیەکی جوگرافیای دیاریکراوی یاساییدا پیادەیان کردبێت و وڵاتیان پێ بەڕێوەبردبێت، بێگومان ئەمیش وەک زۆر بیردۆز و بیرۆکەی پێش خۆی خاڵی نییە لە خەوش و کەلێن، بەڵام لە هەموو ئەوانەی کە مرۆڤ بە ئاوەزی خۆی پێی گەیشتبو باشتر و پێشکەوتووترە.

ئایدۆلۆجیا و ئاستی هۆشیاری و شێوازی بیرکردنەوەی مرۆڤەکان رۆڵی گەورەیان هەیە لە شێوەی جێبەجێ کردنیدا، هەرگیز شێوەیەکی جێگیری نەبوە. بۆیە ئەو وڵاتانەی ئایدۆلۆژیا تیایاندا کاڵە، ئابوورییان بەرزە، کۆمەڵگەکەیان هۆشیارە، نوخبەی سیاسی لە ئاستی بەرپرسیارێتی دەسەڵات بەڕێوەبردندان، دەبینین دیموکراسیەت لەو وڵاتانەدا زیاتر بەرجەستە دەبێت و بوەتە چارەسەرێکی حەوت دەرمانەی گرفت و کێشەکان. هەر وڵاتێکیش پێوەر تەنها ئایدۆلۆجیایە و کۆمەڵگە ناهۆشیارە و نوخبە لە ئاستی بەرپرسیارێتیدا نین، ئەگەر لافی دیموکراسیەتیش لێبدەن، ئەو دیموکراسیەتە دەبینین چەقۆی دەسەڵاتدارانی هێندەی تر تیژکردووە و برینی کۆمەڵگەی قوڵتر کردوەتەوە، ئەو بابەتە ئاراستەو دید جیاوازانەشی لەمیانی تەوەری ئەم ژمارەیەدا خراووەتە ڕوو، خوێندنەوەی جیاوازە لەدیدگای جوداوە بۆ لایەنە ئەرێنی و نەرێنییەکانی دیموکراسی و پەنجە دانانە لەسەر ئەو برینانەی ئەم دەرمانەیان کردۆتە دەرد لەهەندێ شوێن و لەهەندێکی دیکەش بووتە دەرمان، بۆیە دەکرێت بڵێین دیموکراسیەت هەم دەردە و هەم دەرمان.